نیستیوتی بانگخوازان
نووسینگەی هەولێر

# بالاپۆشی

## تاج و ناسنامەیەکی

### پڕ لە شکۆمەندیە بۆ ئافرەتانی بڕوادار



نووسینی: م. شوکریە شێخانی
پێداچوونەوەی: سیروان کاکە أحمد




٢٠١٦

# باڵاپۆشی

## تاج و ناسنامەیەکی پڕ لە شکۆمەندیە

## بۆ ئافرەتانی بڕوادار

نووسینی: م. شوکریە شێخانی

پێداچوونەوەی: سیروان کاکە أحمد

١٤٣٧ك — ٢٠١٦ز

**پێشکەشە بە سەرجەم ئەو ئافرەتە بڕوادارە ڕاستەقینانەی کە:**

- کاتێك گوێبیستی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ دەبن، دەفەرموون ئەی پەروەردگارا! گوێبیستو ملکەچ بووین بۆ فەرمانەکانتان، گوناهەکانی ڕابردوومان بپۆشە.

-گرینگی دەدەن بە ناوەڕۆكو بەردەوام هەوڵی پاك کردنەوەی دڵو دەروونیان دەدەن، لە ڕواڵەتو ناسنامەو هەڵسوکەوتو خوڕەوشتیان وەك ئافرەتێکی بڕواداری پێشەنگ دەردەکەون.

-کات بە سەرمایەو سامانی ژیانیان دەزانن، وە کات تەرخان دەکەن بۆ گرنگی دان بە تواناو لێهاتووەکانیان، ئامادەنین سەرمایەی ژیانیان لە کاری بێ سوود بە فیڕۆ بدەن.

-خۆی زەویەکی پاكو چاكو بە پیتو بەرەکەتە، نەوەیەکی چاکە خواز بەرهەم دەهێنێت، پێشکەش بە کۆمەڵگەی دەکات.

# پێشەکی

کاتێك سەرنج دەدەم لە کۆمەڵگە دیندارو پاکەکەی خۆمان، زۆرێك لە ئافرەتان خاوەن بڕواو خورەوشتو ئاکاری جوانن، وە لە ڕووی خواپەرستیشەوە لە نوێژو ڕۆژو کەم تەرخەم نین ، زۆرێك لەوانە هەڵگری بڕوانامەی بەرزن، بەڵام بە داخەوە لە ڕواڵەتەوە بە شێوەی نیمچە ڕووت دەردەکەون.

جا هەندێکیان دەڵێن: ئێمە لە نێوەڕۆکدا پاکینو ڕواڵەت مەرج نیە!

هەندێکی دیکەیان دەڵێن: پەروەردگار بۆ بەندەکانی بەبەزییەو ئێمەش چاکەمان زۆرە، دەی چاکەکانمان خراپەکانمام دەسڕنەوە، ئەی ئەوە نیە پەروەردگارمان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ١١٤﴾هود

خۆ هەشیانە دەڵێن: چی بکەین هێشتا قەناعەتمان بە بالاپۆشی بۆ دروست نەبووە! ئێمە لە زۆرێك لە ئافرەتە بالاپۆشەکان چاکترین... هتد.

هەموو ئەمانە هانیان دام بیر لە نوسینی ئەم نامیلکەیە بکەمەوەو باس لە پێناسەو جۆرو مەرجو حیکمەتو فەلسەفەو فەرمانو سزاو پاداشتو

سوودو زیانەکانی باڵاپۆشی لە ڕووی شەرعیی‌و زانستی بۆ خوشکانی ئازیزم ڕوون بکەمەوە، ئەو پەیامەیان پێبگەیەنم کە:

باڵا پۆشی بڕوایە، ملکەچیە، خوا پەرستییە، لە خوا ترسیە، تاجە، پاکیە، سترە، شەرم‌و شکۆیە، ناسنامەیە، غیرەتە، وە ئافرەتی باڵاپۆش بە خواپەرست وڕۆژوو گر (الصّوامة والقوّامة) هەژمار دەکرێ، کە پاداشتەکەی بریتیە لە بەهەشتی نەبڕاوە، باڵانەپۆشی بریتیە لە سەرکەشی‌و بێ فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی (درودی خوای لێ بێ) بە درێژایی کات‌و ساتەکان سزاکەی بریتە لە دۆزخ، لە کۆتایی نامیلکەکە چەند ڕووداوێکی ڕاستەقینە باسکراوە، لەگەڵ چەند موژدەیەکی خۆش لە فەرموودەکانی پێغەمبەری (درودی خوای لێ بێ). بە هیوام ئەم نامیلکە بگات بە دەست سەرجەم ئەو خوشکانەی کە پێوستیان بە ڕێنمایی کردنە بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی باڵا پۆشیە.

لێرەشەوە زۆر سوپاسی برای بەڕێزم کاك (سیروان کاکە أحمد) دەکەم کە ئەرکی پێداچوونەوەو دیزاینی گرتە ئەستۆی خۆی، خوای گەورە ئەم کارەشی بخاتە سەر تەرازووی کردوە چاکەکانی دیکەی.

# بالاّ پۆشی (الحجاب)

پێناسەی (الحِجْابُ):

له ئەسڵی زماندا: (السِّتْرُ والْمَنْعُ) واته: پارێزگاری کردنو ڕێگا گرتن، داپۆشین.

له زاراوی شەرعدا: بریتیە له پاراستنی گشت ئەندامەکانی جەستە لە دەرخستنی جوانیەکانی بەرانبەر بە ڕەگەزەکەی تر، ئەم پاراستنەش بە جل و بەرگی شەرعی ئەنجام دەدرێ.

## حیکمەتو فەلسەفەی بالاّ پۆشی:

١- ناسنامەو تاجو پاکی ئافرەتی بڕوادارە، بەڵکو نیشانەی بڕواداریەتی ئافرەتی مسوڵمانە.

٢- دەربڕینێکی ڕاستەقینەیە کە لە ناخی ئافرەتی بڕواداردایە بەڕوای بە لێزانی و کارجوانی و زاناییو دانایی و فەلسەفەی فەرمانی دروستکارو پەروەردگاری خۆی هەیە، کاتێك ئەو جۆرە جلو بەرگانە دەپۆشێت هەست بە ئارامی دڵو پارێزراوی جەستەو شکۆی خۆی دەکات، بەڵێ، هەستدەکات ئەو مرۆڤێکی ڕێز لێ گیراوە لە لایەن ئەهلی ئاسمانو زەوی دەزانێت ژیان تەنیا بریتی نیە لە لایەنە ماددیو شەهوانیەکەی بەڵکو بە چاوی ژیری ناوەڕۆکی شتەکان دەبینێت.

٣- ئافرەتی بڕوادار کاتێك کە حیجاب دەپۆشێت بە تەواوی هەست بە بەرپرسیاریەتی دەکاتو دەزانێ بالاّ پۆشی مانایەکی گشتگیری هەیە، سەرجەم ڕەفتارو کردارو گوفتارو هەڵسوکەوتێکی دەگرێتەوە.

٤- بالاّ پۆشی جۆرێك لە کەسایەتیو هەیبەتو ئازادی بەئافرەتی باوەڕدار دەبەخشێت، ئەو جوانیو ناسکیەی کە پەروەردگار پێی بەخشیوە هەرگیز

ڕێگا نادات وەك كەڵو پەلێكی بێ نرخ هەر كەسێك حەز بكـات لـەزەتو تام و چێژ لە سەیركردنی وەربگرێ.

٥- لە پێناو لێكەوتنەوەی نەوەیەكی پاكو بێگەردو پەیوەست بـە ئـاینو داب و نەریت لە كاتێكدا كۆرپە كە چاوی دەكاتەوە، ژیـان و دەوروبـەری خۆی دەبینێت، هەڵبەتە یەكەم كەس دایك و باوكێكی پاك و پەیوەست بە ئاین دەبینێت پێشنگیو بەرەكەتی ئـەوان ڕاسـتەوخۆ كاریگـەری لەسـەر جگەر گۆشە دەبینێت.

٦- هەڵبەتـە شـەرعو بەرنامـەی پـەروەردگاری زانـاو دانـاو كاربـەجێ هاوسەنگو یەكگرە لەگەڵ عەقڵی دروستو تەندروستو فـیترەی ڕاسـت، هەڵبەتە یاساو ڕێسایەكانی پەروەردگار گشتی دادگەریو كاربەجێییو كار جوانیو بەزەیی زۆری تێدایە بۆ بەندەكانی.

٧- لە پێناو پاراستنی مرۆڤو نەكەوتنـە نێـو لێـواری گونـاه و تـاوان و لادانو بەدڕەوشتیو لێككەوتەی خراپو توڕەبوونی پەروەردگار.

٨- باڵا پۆشی ڕێزێكی پەروەردگارە بـۆ ئـافرەتی بـڕوادار بـە هـۆی بـالا پۆشیەوە ئافرەتی بڕوادار وەك فریشـتەو (الحـور العـین)ی لێـدێ لـە ڕووی

سیفەتەوە، چونکە بالاّ پۆشی ڕێگرە لە سەیرکردن و چێژ وەرگرتن لە جوانی و قەشەنگی ئافرەت لەلایەن ڕەگەزی بەرانبەرەوە تەنها بۆ هاوسەرەکەی خۆی نەبێت، پەروەردگار بەم شێوازە باسی سیفاتی حۆریەکانی بەهەشت دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٞ قَبۡلَهُمۡ وَلَا جَآنّٞ ٥٦ ﴾الرحمن، واتە: لەو بەهەشتەدا حۆری تێدایە کە تەنیا تەماشای پیاوەکانیان دەکەن، وە پێش هاوسەرەکانیان دەستی کەسیان پێ نەکەوتوە، نە ئادەمیزادو نە جن.

# جۆرەکانی بالآ پۆشی

یەکەم: ڕواڵەتی (الظاهري): بریتیە لەو پۆشتەیەی کە پەروەردگار لە قورئانی پیرۆز فەرمانی بە کچانو ئافرەتانی بڕوادار کردوە لە ئاست پیاوانی نامەحرەم بە شێوەیەکی ڕاشکاوانە لە قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێکراوەو زانایانی شەرع ناس ئاماژەیان بە مەرجو شێوازو جۆرەکانی کردوە بەم زاراوانە لە قورئانی پیرۆز هاتوە:

أ/ (النقاب): بریتیە لە پۆشینی هەموو جەستە لەگەڵ دەستو ڕووخسار.

هەندێك لە شەرع ناسەکان ئەم جۆرە بالآ پۆشە بە فەرز و واجب دەزانن وەك ابن تیمیه ابن عسیمین .

ب/ بالآ پۆشی ئاسایی: بریتیە لە پۆشینی گشت جەستە جگە لە دەستو ڕووخسار.

دەرخستنی دەستو ڕووخسار بە شێوەیەکی سروشتی لە لایەن هەندێك لە شەرع ناسەکان ڕێگا پێدراوە وەك: پێشەوایان لە زانایانی سەلەف (أبو

حنيفة ومالك)[1] وە لە زانایانی سەردەم (محمد ناصر الدين الألباني و يوسف القرضاوي)، بە بەڵگەی ئایەتی: ﴿وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ﴿٣١﴾﴾ النور، واتە: داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناهو جوانی خۆیان دەرنەخەن، جگە لەوەی دیارە، (وەك دەستو ڕووخسار)، با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینەو ملیاندا..

ئەم زانایانە پۆشینی دەستو ڕوخساریان بە سوننەتو موستەحەب داناوە.

ج/ **(الخمار):** هەروەك لە سوورەتی (النور) ئاماژەی پێ کراوە ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ﴿٣١﴾﴾ النور.

بریتیە لە واجب بونی پۆشینی سەرو قژو سینگ بە پارچە قوماشێکی گونجاو، کەوابێت جیاوازی لە نێوان (الحجاب و الخمار) ئەوەیە کە حیجاب هەموو جەستە دەپارێزێ، بەڵام (خمار) تەنا سەرو قژو سینگ دادەپۆشێ.

---

١) فتاوى موقع الألوكة، المؤلف: مجموعة من العلماء.

د/ **(الجلباب)**: بریتیە لە دوو پارچە قوماش کە سەرجەم جەستەو ڕووخساری ئافرەت دەپۆشیّ، نیوەی وەك تەنورە، یان عەزیە، دەپۆشریّت بەشی دووەمی لە سەرەوە تاکو چۆك دادەپۆشیّت، یان وەك شێوەی عەبای سعودی دەپۆشریّ.

**دووەم: پەنهانی (الباطني)**: بریتیە لەو پۆشتەیەی کە پەروەردگاری بالادەست فەرمانی بە ئافرەتانو کچانو پیاوانو گەنجانی بڕوادار کردوە کە بریتیە لە خۆپاراستنو خۆدورخستنەوە لە سەرجەم هەڵسوکەوتی نەشیاو بەڵکو ئەنجامدانی سەرجەم ئاکارو ڕەوشت و هەڵسوکەوتی بەرزو جوانو شیاو، بالاپۆشی ڕواڵەتی دەبێتە تەواوکاری ئەم بالاپۆشیە، ئەم بالا پۆشیە سەرجەم ڕەوشتو ئاکارو هەڵسوکەوتو سلوکی بەرزو جوان دەگرێتەوە، ئەوەتا پەروەردگاری بالا دەست لە سووڕەتی (النور) بە شێوەیەکی زۆر ڕاشکاوانە فەرمانی پێکردوە، فەرموویەتی: ﴿قُل لِّلۡمُؤۡمِنِينَ يَغُضُّواْ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِمۡ وَيَحۡفَظُواْ فُرُوجَهُمۡ ...(٣٠)﴾ واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: بە پیاوانی ئیماندار چاوی خۆیان (لە سەیر کردنی ئافرەتی نامەحرەم) دابخەنو بپارێزن، وە عەوڕەتیان (لە داوێن پیسیی)، بپارێزن.

هـــەروەها بـــە ئافرەتـــانی بـــڕواداریش دەفـــەرموێ: ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ﴿٣١﴾ ﴾.

واتە: بە ئافرەتانی بڕوادار بڵـێ: چـاویان بپـارێزن (لـە تەماشـا کردنـی نامەحرەم)، داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناهو جوانی خۆیـان دەرنەخـەن، جگە لەوەی کە دەردەکەوێو دیارە وەك (دەستەکانو دەمو چاو).

## مەرجەکانی بالاَ پۆشی:

کۆمەڵێك مەرج هەن کە لە کۆی وتەی شەرعناسان وەرگیراوە، بریتین لە:

١- تەسك نەبێ بە شێوەیەك بەرزو نزمی جەستەی ئافرەتی تێدا دەربکەوێ.

٢- تەنك نەبێت بە شێوەیەك جلەکانی ژێرەوە دەربخات.

٣-سەرنج ڕاکێش نەبێ، سەرنجی گەنجانو پیاوان بە لای خۆی ڕابکێشێ.

٤- پێویستە هەموو جەستە داپۆشێت جگە لە دەستو دەمو چاو.

٥- جلو بەرگێکی ڕێكو پێكو شیاو بە ئافرەتان بێ، بە جلو بەرگی پیاوانو کافران نەچێ.

٦- جلو بەرگێکی ئاسایی بێ، ئەوەندە گران بەها نەبێت کە لە نێو کۆمەڵگە شاز بێت.

٧- بۆندار نەکرابێ، چونکە هەر چ جۆرە بۆنێك بەکارهێنانی بۆ ئافرەت لە کاتی چوونە دەرەوە حەرامە، دروست نیە.

بە داخەوە هەندێك لە ئافرەتـان بـۆن لـە خۆیـان و جـل و بەرگـەکانیان دەدەن، پاشـان دەڵـێن: ئێمـە لـە کـاتی چـوونە دەرەوە بۆتـمان بەکارنەهێناوە! لە دوا لێکۆڵینەوەی زانستی دەرکـەوتووە پیـاو کاتێـك سەیری ئافرەتێك دەکات ئەگەر ئەو ئافرەتە بۆندار بێـت کاریگـەری دوو ئەوەندە دەبێت بۆ لە یاد کردنی لەسەر هەست و سـۆزی، پێویسـتی بـە دوو ئەوەندە کات هەیە بۆ لە یاد کردنیێ، دەرکردنی لە بیر و هەسـت و هۆشی.

زانایانی شەرع ناس فەرموویانە: بالاٌپۆشی پێنج (٥) شت دەگرێتەوە:

١- پۆشینی سەرو قژ.

٢- پۆشینی هەموو جەستە جگە لە دەست و دەم و چاو[٢].

٣- بەکارنەهێنانی موکیاج دەستکاری نەکردنی برۆ.

٤-بەکارنەهێنانی بۆن.

---

٢) پۆشینی دەستو ڕوخساریش ڕاو بۆچوونی جیاوازی لەسەرە، هەندێك لـە شەرع ناسەکان بە واجبی دەزانن، هەندێکی دی بە سوننەتو مستەحبی دەزانن.

## گرینگترین سوودەکانی بالاّ پۆشی

١-بالاّپۆشی هۆکارێکە بۆ پاك ڕاگرتنی دڵو دەروونی ئافرەتانو پیاوانی بڕوادارو بنیاتنانیان لەسەر بناغەی لە خوا ترسیو بە گەورە زانینی قەدەغەکراوەکان، ئەم ڕاستیەش لە قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێکراوە لە سوورەتی (الأحزاب)، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ﴿٥٣﴾﴾.

واتە: ئەم جۆرە ڕەفتارە چاکترو پاکترە بۆ دڵی ئێوە "ئەی پیاوەکان"، وە بۆ دڵی ئەوانیش "واتە: ئافرەتەکان".

لەم ئایەتە پیرۆزە پەروەردگار وەسفی حیجابی بە پاکی کردووە بۆ دڵو دەروون، چونکە تا چاو نەبینێت دڵیش حەزی بۆی ناچێت.

٢- بالاّ پۆشی پاسەوانێکی شەرعی بە هێزە بۆ پاراستنی ئابڕو، وە هەروەها پاراستنی لە هۆکارەکانی گومانو ئاشوبو تێکدانی خێزانو کۆمەڵگە.

٣- بالاّ پۆشی بانگدەرێکە بۆ ڕێزگرتن لە خوو ڕەوشتی جوانو شەرمو شکۆ.

٤- بالاّ پۆشی تاجێکی پڕ لە شکۆمەندیە بەسەر ئافرەتی بڕوادار بەڵگەی پاکی ناوەڕۆکیان لە ڕواڵەتدا دەردەکەوێت، بەڵکو قەڵغانێکە بۆ خۆ پاراستنیان لە بەد ڕەوشتیو داوێن پیسی.

٥- بالاّ پۆشی یەکێکە لە درووشمەکانی ئیسلام، ناسنامەیەکی پڕ لە شکۆیە بۆ ئافرەتی بڕوادار .

٦- بالاّ پۆشی بەڵگەی ژیریو تێگەیشتنی ئافرەتی بڕوادارە لە سروشتی ڕەگەزی بەرانبەر، چونکە ئافرەتی بڕواداری ژیر هەروا بە خۆڕایی خۆی تووشی ئازارو کێشەو تانەو تەشەری گەنجانی شەهوانی ناکات، گۆشت ناخاتە بەردەم پشیلەو، پاشان گلەیی خواردنی لێبکات، ئەوەتا پەروەردگار لە سوورەتی ئەحزاب کاتێك باسی هۆکاری دەرکردنی فرمانی بالاّ پۆشی کردوە، لە پێناو بەرژەوەندی ئافرەتو دوورخستەوەی ئازار بووە لێی، وەك دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ

﴿٥٩﴾، واتە: ئەوە لەبارترین شتە کە پێی بناسرێن، تا ئازار نـەدرێن، "تووشی گێرو کرفت نەبن".

٧- باڵا پۆشی ملکەچیو پەرستشێکە، زانایانی شەرع ناس فەرموویانە: ئافرەتی باڵاپۆش، پاداشتی بە (ڕۆژ) ڕۆژووگرتنو بە (شەو) شـەو نوێـژ کردنی بۆ هەژمار دەکرێ.

٨- باڵا پۆشی، واتە: پۆشینی جلو بەرگی لە خوا ترسیو بڕواو متمان بوونە بە کاربەجێیی فەرمانەکانی پەروەردگار، کە پڕن لە کاربەجێییو سوود بۆ بەندەکانی، وەك خوای پەروەردگار دەفەموێ:: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴿٢٦﴾ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآۚ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡۗ إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾الأعراف.

واتــە: ئــەی نــەوەی ئــادەم! ئــەوە پۆشــاکمان دابەزاندۆتــە ســەرتان عەورەتەکانتان دادەپۆشیٚ، وە بۆ ڕازاندەوەشتان، وە پۆشاکی پارێزکاریی ئا ئەوە چاکترە، ئەو "ڕەخساندنی پۆشــاك"ەش لــە نیشــانەکانی خوایــە بەڵکو بێتەوە یادیان "کە چۆن بژین بەرێوەبچــن!" ئــەی نــەوەی ئــادەم! "وریابن" شەیتان فریوتان نەدات، وەك چۆن باب‌و دایکتانی وەدەرنــان، پۆشاکەکانی لیٚ دادەڕنین تاکو عەورەتەکانی خۆیانیان پیٚ نیشان بــدات، بە دڵنیاییەوە خۆی‌و کۆمەڵەکەی ئێوە دەبینن، "بەڵام" ئێوە نایانبینن، "واتە: ئیبلیس‌و کۆمەڵەکەی ئێوە دەبینن، بەڵام ئێوە ئــەوان نــابینن"، مسۆگەر ئێمە شەیتانەکانمان کردوونە دۆست‌و نیزیکی ئەوانەی کە بــڕوا ناهێنن.

وە پەروەردگار ئەو جوانیە بەرچاویەی کە ئافرەتان بە هۆی باڵاپۆشــیەوە لە دەستی دەدەن بۆیان قەرەبوو دەکاتەوە بە جوانیەکی ناوەڕۆکی پڕ لــە نوور کە دڵەکان بە سەیرکردنی ڕووناك دەبنەوە.

٩- باڵا پۆشی هۆکارێکە بۆ ڕێگــا گــرتن لــە حــەزە شــەیتانیەکان کــە دەرکەوتنی ئافرەت بە شێوەی نیمچە ڕووت و ڕاکێشانی سەرەنجی پیاوان

و جووڵاندنی هەستو سۆزو ئارەزووە سێکسیەکان دواجار ڕوودانی تێکەڵاوی سێکسی ناشەرعی.

١٠- باڵا پۆشی نیشانەی شەرمو شکۆیە (الحیاء)ە، کە لە (حیاة)ەوە، هاتوە، واتە: بوونی ژیانێکی پڕ لە سەر بەرزی و شکۆمەندی، ئەمەش فیترەت و سروشت و بناغە و بنچینەی پاکی ئافرەتی بڕوادارە، باوەڕی پتەوی وای لێدەکات سروشتی ناسك و پاك و حەیاو حورمەتی خۆی بپارێزێت، هەرگیز خۆی بچوك ناکاتەوە بە پۆشینی جل و بەرگی تەسك و کورت و سەرنج ڕاکێشەر و نیمچە ڕووت، بەڵکوو گەورەیی خۆی لە باڵاپۆشی دەبینێتەوە.

ئـەوەتا پێغەمبـەری خـوا درود و سـلاّوی خـوای گـەورەی لـێ بێـت فەرموویەتی: {«إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ حَيِيٌّ سِتِّيرٌ يُحِبُّ الْحَيَاءَ وَالسَّتْرَ فَإِذَا اغْتَسَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَتِرْ»}[٣]

واتە: بێگومان خوای زاڵی پایەدار زیندووو داپۆشەرە حەزی بـە شـەرمو شکۆیە، داپۆشەر (عەیبانە)، بۆیە هەر یەکێك لە خۆی شۆرد، با خـۆی (باش) داپۆشێ.

١١- بالاّ پۆشی نیشانەی باوەڕە، ئەوەتا پەروەردگار فەرمانی بالاّ پۆشی تەنها ئاڕاستەی ئافرەتانی بڕوادار کردوە، وەك لـە سـوورەتی (النـور)دا دەفـــــەرموێ: ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ﴿٣١﴾ ﴾.

---

٣) أخرجـه أحمـد بـرقم: (١٧٩٩٩)، وأبـو داود بـرقم: (٤٠١٢)، والنسـائي برقم: (٤٠٦)، وصححه الألباني في "صحيح سنن أبي داود".

واتە: بە ئافرەتانی بڕوادار بڵـێ: چـاویان بپـارێزن (لـە تەماشـا کردنـی نامەحرەم)، داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناهو جوانی خۆیـان دەرنەخـەن، جگە لەوەی کە دەردەکەویّو دیارە وەك (دەستەکانو دەمو چاو).

وە هـەروەها پـەروەردگارمان دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ... (٥٩) ﴾.

واتە: ئەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم! بە هاوسەرانتو کچـەکانتو ئافرەتانی بڕوادار بڵێ: بـا بـە پۆشـاکی پۆشـەو بـالاَ داپۆشـەر خۆیـان بپۆشن..

١٢- بالاَ پۆشی پاراستنی ئافرەتە لە حەسوودو چاوپیسی کەسانێك کـە حەسەدو چاوپیسن بە تایبەتی ئەگەر ئافرەت خاوەنی قژ و دەم و چـاو و بەژن بالاَیەکی شۆخو شەنگ و جوان بوو.

١٣- لە ڕووی کۆمەلاَیەتی کاتێك ئافرەتێکی بالاَپۆش دەبینریّ، دەڵێن: ئـەم ئافرەتـە مسـوڵمانە، بـڕوادارە، بـالاَ پۆشـینەکەی لـە ئـافرەتی نەصرانییو جولەکە جیای دەکاتەوە.

## سودەکانی باڵا پۆشی لە ڕووی زانستیەوە:

١- لە دەرەنجامی چەند توێژینەوەیەکی زانستی نوێ ئاماژەیان بەوە کردوە کە دەرخستنی بەشێك لە جەستەی ئافرەتو پۆشینی جلو بەرگی نیچە ڕووت، هۆکارە بۆ تووشبوون بە چەند نەخۆشیەك لە ترسناکترینی ئەو نەخۆشیانە، شێرپەنجەیە، بە تایبەتی ئەو بەشانە دەگرێتەوە کە بەردەوام دەردەکەون، هەروەکوو لە گۆڤارێکی پزیشکی بەریتانی هاتووە شێرپەنجەی (الميلا نوما) کە یەکێکە لە جۆرەکانی شێرپەنجە ترسناکەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕێژەی تووشبوان بەم نەخۆشیە سەختە ڕووی لە زیاد بوونە، بە تایبەتی لە نێو ئەو کچ و ئافرەتە گەنجانەی جل و بەرگی کورت و تەسك دەپۆشن، کە ئەمەش ڕاستەوخۆ دەبێتە هۆکاری بەریەك کەوتنی تیشکی خۆرو تیشکی سەروو وەنەوشەیی، وە بەڕێژەیەکی زۆر بە درێژایی ساڵ کە بەر لاشەی ئافرەت دەکەوێت ئەگەر چی جلی نایلۆن و گۆرەوی تەنك و لاستیکیان پۆشیبێت بەڵام لە توێژینەوەکان دەرکەوتوە ئەم جۆرە جلانە هیچ لە زیانەکانی کەم ناکاتەوە.

هەڵبەتە ئەم دوو جۆرە تیشکە لە سەرەتا وەك پەڵیەکی بچووك لە شوێنێکی جەستە بە ڕەنگی ڕەش دەر دەکەوێت بە تایبەتی لە ڕووخسار یان لە دەستو قاچ دەردەکەوێت، پاشان بلاّو دەبێتەوە کێشە گەورەکە لەوە دایە ئەم جۆرە شێرپەنجەیە چارەسەری نیە لە هەمان کاتتا بۆ کۆرپەی ناو سکیش دەگوازرێتەوە.

٢- لە ئاکامی کۆمەڵێك توێژینەوەی دی دەرکەوتووە پۆشینی سەرپۆش بۆ ئافرەتان سودێکی زۆر گەورە و گرینگی هەیە، چوونکە کاتێ تیشکی خۆر بەر سەرو قژ دەکەوێت بە هۆی بوونی تیشکی هەمەجۆرو زیانبەخش لە نێو تیشکی خۆر، وە لەسەرووی هەموشیانەوە تیشکی سەروو وەنەوشەیی ئەم جۆرە تیشکە زیانی بۆ ئافرەت زۆر زیاترە وەك لە پیاو چونکە ژێر پیستی ئافرەت (سمل تبقه الدهون) ژێر پیستی ئافرەت گەورەترە لە ژێر پیستی پیاو، تیشکی سەروو وەنەوشەیی لەگەڵ مادده پرۆتینیەکانی ژێر پێست کارلێك دەکەن لە ئاکامدا دەبێتە هۆکاری سەر هەڵدانی چەند نەخۆشیەك لە ترسانکترینیان شێرپەنجەی پێست و هەڵوەرینی قژە، هەروەها کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لە وشکبوونی

قژ، لـە کـۆی دەرەنجـامی توێژینـەوەکان دەرکـەوتووە پۆشـینی لەچـك کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لە پاراستنی قژ لە وشك بوون هەڵوەرین.

٣-دکتۆر (محمد ندا) پسپۆڕ لە نەخۆشیەکانی پێست لە قـاهیرە جـەخت لەوە دەکاتەوە کە بالاّپۆشی پارێزگاری لە قـژ دەکـات، چـونکە لێـدانی تیشـکی خـۆر بـە شـێوەیەکی ڕاسـتەخۆ دەبێتـە هـۆی لـە دەسـتدانو هەڵوەرینی قژ بە هۆی لاوازیو کاڵی لە ڕەنگی، هەروەها ئاماژەی بـەوە کردوە لێدانی هەوا (ئۆکسـجین) هۆکـاری وەرگـرتنی مـادەی خـۆراکی (تغذیة) نیە، چونکە ئەو بەشە دیارەی قژ دەکەوێتـە تـوێی سـەر(خلایا قرنیە) کە ژیانی تیادانیە، بەڵکو قژ پێداویستی خۆی لە ڕێگای پێسـت لە ناو خوێن وەردەگرێت.

٤-دکتورە (مەی السماحی) پزیشکی پسپۆڕ لە زانکۆی (عین الشـمس) دەفـەرموێ: پۆشـینی لەچـك و بالاّپۆشـی شـەرعی دوورو نزیـك هـیچ پەیوەندیەکی خراپ (سلبی) لەسەر قژ نیە` کە ئەمەش دوای ئەنجامدانی توێژینەوە و تاقیکردنەوە لەسـە کۆمـەڵێك ئـافرەتی بـالاّپۆش و سـفور دەرکەوتووە بالاّپۆشی هیچ پەیوەندیەکی بە هەڵوەرینی قژ نیە، بەڵکو بە

پێچەوانەوە پۆشینی لەچك قژ دەپارێزێت لە كاریگەریە ژینگەییەكان، وە ئاماژە بەوە دەكات باشتر وایە ئەو جۆرە لەچكانە بپۆشرێن كە لەلۆكە دروست كراون.

ناوبراو جەخت لەوە دەكاتەوە كە دوو هۆكاری سەرەكی قژ وەرین هەن كە بریتین لە:

أ - باری دەروونی ناجێگیر، زاڵبوون بەسەر دوو دڵی‌و دڵەڕاوكێ‌و غەم و خەفەت هۆكاری باشن لە ڕێگا گرتن لە هەڵوەرینی قژ.

ب -خراپی تەندروستی جەستەیی، چونكە قژ ڕاستەوخۆ خۆراك لە جەستە وەردەگرێت، وە ڕەنگە جەستەش كێشەی كەمی خۆراكی هەبێ بە تایبەتی سەوزەو میوەو پرۆتیاتەكان، گرینگیدان بە تەندروستی لاشە و هەمە چەشن كردنی خواردن‌و زیاد بەكارنەهینانی شامپۆ و كرێم هۆكارێكە لە ڕێگا گرتن لە هەڵوەرینی قژ.

٥- زانایانی ڕۆژئاوا بە شێوەیەكی بەردەوام لە سەرجەم هۆكارەكانی ڕاگەیاندن بە هۆی زیادبوونێكی ترسناك لە ڕێژەی دەست درێژكردنی

سێکسی (الإغتصاب) جەخت لەسەر پێویستی بالاّپۆشی ئافرەتان و لەیەك جیاکردنەوەی هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ دەکەن.

لە سەرژمێریەك لە ولاّتی ئەمەریکا سالاّنە یەك ملیۆن کۆرپە بەشێوەی ناشەرعی پەیدا دەبن و یەك ملیۆن کۆرپەش کە بە شێوەی ناشەرعی دروست بوو لە بار دەبردرێن، هەروەها ئێستا لە جیهان بە هۆی تێکەڵبوونی ناشەرعی چل ملیون کەس لە سەرتاسەری هەموو جیهان تووشی نەخۆشی ئایدز بوونە کە ئەمانە جەستەیان خاپوور بووە و بەرەو مردن هەنگاو دەنێن.

## بەڵگەکانی فەرز بوونی باڵا پۆشی لە قورئان و سوننەت:

١- خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ ﴾ الأحزاب.

واتە: بۆ هیچ پیاوێکی بڕوادار یان ئافرەتێکی بڕوادار نیە کاتێك خوا و پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێك بدەن، ئەوان سەرپشك بن، (لە ئەنجامدانی ئەم کارە)، چونکە ئەوەی سەرپێچی بکات لە فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی ئیدی ئەوە بە ئاشکرا گومڕاو سەر لێشێواوە.

٢- وە خوای باڵادەست دەفەرموێ: ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ﴿٣١﴾ ﴾.

واته: به ئافرەتانی بڕوادار بڵـێ: چـاویان بپـارێزن (لـه تەماشـا کردنـی نامەحرەم)، داوێنی خۆیان بپارێزن له گوناهو جوانی خۆیـان دەرنەخـەن، جگه لەوەی که دەردەکەوێو دیاره وەك (دەستەکانو دەمو چاو).

٣- خـوای کاربـەجێ دەفـەرموێ: ﴿ وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَىٰ ﴿٣٣﴾ ﴾ الأحزاب.

واته: ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر صـلی الله علیـه وسـلم لـه ماڵـەکانی خۆتان به سەنگینیو سەلاری بسرەون، جوانی خۆتـان دەرمەخـەن، وەك سەردەمی نەفامیی یەکەم.

٤- خـوای گـەوره بـه هـاوەڵانی پێغەمبـەر صـلی الله علیـه وسـلم دەفـــــەرموێ: ﴿ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ .. ﴿٥٣﴾ ﴾ الأحزاب.

واتە: ئەگەر داوای شتێكی پێویستان لە (هاوسەرانی پێغەمبەری خوا كرد) لە پشتی پەردەوە داوایان لێ بكەن، ئا ئەو جۆرە ڕەفتارە چاكترەو پاكترە بۆ دڵی ئێوەو ئەوانیش..

٥- وە هەروەها پەروەردگارمان دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ...(٥٩) ﴾.

واتە: ئەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم! بە هاوسەرانتو كچەكانتو ئافرەتانی بڕوادار بڵێ: با بە پۆشاكی پۆشەو باڵا داپۆشەر خۆیان بپۆشن..

٦- وە لە سوورەتی ئەعراف فەرموویەتی: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ (٢٦) ﴾.

واتە: ئەی نەوەی ئادەم! ئەوە پۆشاكمان دابەزاندۆتە سەرتان عەورەتەكانتان دادەپۆشێ، وە بۆ ڕازاندەوەشتان، وە پۆشاكی پارێزكاریی

تا ئەوە چاکترە، ئەو (ڕەخساندنی پۆشاك)ەش لە نیشانەکانی خوایە بەڵکو بیتەوە یادیان (کە چۆن بژین بەڕێوەبچن)!

٧- {«إِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ حَيِىٌّ سِتِّيرٌ يُحِبُّ الْحَيَاءَ وَالسَّتْرَ فَإِذَا اغْتَسَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَتِرْ»}[٤].

واتە: بێگومان خوای زاڵی پایەدار زیندووەو حەزی بە شەرمو شکۆو داپۆشینە، بۆیە هەر یەکێك لە خۆی شۆرد، با خۆی (باش) داپۆشێ.

٨- پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ: {صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا: قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ البَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ، وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ مُمِيلاَتٌ مَائِلاَتٌ، رُؤُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ البُخْتِ المائِلَةِ لاَ يَدْخُلْنَ الجَنَّةَ، وَلاَ يَجِدْنَ رِيحَهَا، وإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا}[٥].

---

٤) أخرجه أحمد برقم: (١٧٩٩٩)، وأبو داود برقم: (٤٠١٢)، والنسائي برقم: (٤٠٦)، وصححه الألباني في "صحيح سنن أبي داود".

٥) أخرجه أحمد برقم: (٨٦٥٠)، ومسلم برقم: (٢١٢٨).

واتە: دوو چین لە ئەهلی ئاگرن، نەمبینیون: کۆمەڵکیان قامچیان بە دەستەوەیە بە ستەم لە خەڵك دەدەن، وە کۆمەڵێکیان ئافرەتانێکن کە بە جلی نیمچە ڕووت بە دەردەکەون...

٩- پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {أَيُّمَا امْرَأَةٍ نَزَعَتْ ثِيَابَهَا فِي غَيْرِ بَيْتِ زَوْجِهَا هَتَكَتْ سِتْرَ مَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ رَبِّهَا}(٦).

واتە: هەر ئافرەتێك جلو بەرگی خۆی داکەند جگە لە ماڵی هاوسەرەکەی، ئەوە شەرمو شکۆو پەردەی نێوان خۆیو پەروەردگاری شکاندوە!

١٠- ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لە لاپەڕە (٤٩٠)ی بەرگی (٨)ی (فتح الباری)دا دەڵێ: (قَالَتْ إِنَّ نِسَاء قُرَيْش لَفضلاء وَلكِنّي وَاللهِ مَا رَأَيْتُ أَفْضَل مِنْ نِسَاء الأَنْصَارِ أَشَدّ تَصْدِيقاً بكِتَابِ اللهِ وَلا إِيمَانًا بالتَّنْزِيلِ..)

٦) أخرجه أحمد برقم: (٢٥٦٦٨)، وابن ماجه برقم: (٣٧٥٠).

واتە: دایکمان عائیشە خـوا لێـی ڕازی بـێ، فەرموویـەتی: ئافرەتـانی قورەیش خاوەن فەزڵو بەخشی خوان، بـەڵام وەڵڵاهـی هـیچ ئـافرەتێکم نەبینیوە وەك ئافرەتانی پشتیوانان، کتێبیی خوای گـەورەیان بـە ڕاسـت زانیبێو بڕوایان بە قورئان بێ.

## چەند ئامۆژگاریەکی بە سوود

١- بالاّ پۆشی ملکەچیو گوێڕایەڵیە بۆ فەرمانەکانی خواو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئایا تۆ ناتەوێ، یەکێك بیت لەو کەسانەی ملکەچو گوێڕایەڵن بۆ فەرمانەکانی خواو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەم مژدە خۆشە وەربگری هاوڕێ لەگەڵ پێغەمبەرانو ڕاستگۆیانو شەهیدانو چاکە کاران بیت لە بەهەشتدا، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّـٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُو۟لَـٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ﴾ النساء.

واتە: هەر کەسێکیش فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر بکات، ئەوە ئەوانە لەگەڵ کەسانێك دان کە خوا چاکەی لەگەڵ کردوون لە پێغەمبەران صیددیقانو شەهیدانو صالّحان ئەوانەش باشترین هاوەڵن.

٢- نەپۆشینی حیجاب مانای سەرکەشی کردنو بێ فەرمانی کردنی خواو پێغەمبەرەکەیەتی پەروەردگاریش زۆر بە توندی ئاگادارمان

دەکاتەوە لە سەرپێچی کردنی فرمانەکانی بە توشبوونی بە فیتنەو ئاشوب لە ژیانی دونیاو سزایێکی بە ئازارو دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ ﴾النور، با وریابن‌و بترسێن ئەوانەی سەرپێچی لە فەرمانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەکەن...

٣- خوشکە ئازیزەکەم تۆ خۆت وێنەو ناسنامەی خۆت دیاری بکە، ئایا تۆ وێنەی عائیشەو فاتیمەو ئاسیاو مەریەمی یان وێنەی خیزانەکانی لوت و نوح و ئەبو لەهەبی؟

٤- بالاٚ پۆشی ملکەچیە، خواپەرستیە، تاجە، پاکیە، سترە، لە خوا ترسیە، باوەڕە، شەرم و شکۆیە، غیرەتە، ڕەتکردنەوەی هەموو ئەو وەسفە جوانانە ئایا ماناى چی دەگەیەنێ؟ مەگەر بێ ئاگایی نەبێ، دیارە ئەم بێ ئاگاییەش تەمەن ون دەبێت هەروەکوو وتراوە لە گیرفانی دڕاو پارە ون دەبێ.

٥- سەرقاڵ بوون بە شێوەیەکی بەردەوام بە خۆڕازاندنەوە و جل و بەرگ بۆ دەرەوەی ماڵ کات و ژیان لە دەست دەدەن و گرینگیدان بە ناوەڕۆكو خۆ دەوڵەمەند کردن بۆ بەهێز کردنی تواناو لێهاتوویی کز دەکات.

هەڵبەتە تواناو لێهاتوویی ئافرەت پێوەرێکی سەرەکیە بۆ هەڵبژاردنو بوونی بە کەسێکی سەرکردەو پێشڕەو، لە کاتێکدا لە ولاتی پاکستان خاتوون (فاتیمە نجاح) لەگەڵ (أیوب خان) هەردووکیان بۆ سەرۆکایەتی پاکستان پاڵێورابوون، پێشبرکێیەکی بەهێز لە نێوانیاندا هەبوو لەو سەردەمەدا (ئەبو ئەعلی مەودودی) گەورەترین زانای ئەو سەردەمە بوو، لە فتوایەکیدا داوای لە دەنگ دەران کرد کە دەنگ بدەن بە خاتوون (فاتیمە نجاح) چونکە ئەو توانا و لێهاتووی زیاترە.

٦- بەرووبومی چاكو بە سود لە زەوی چاكو پیتو بە فەر بەرهەم دێت، ئەو دایکەی خۆی پاكو گوێڕایەڵو ملکەچە بۆ فەرمانەکانی خواو قورئان خوێنەو پەیوەستە بە قورئان، دەبێت بە پێشەنگێکی چاك بۆ جگەر گۆشەکانی خۆیو بە تایبەتی کچەکانی، وەك خۆی بالآپۆشو

ملکەچو گوێڕایەڵ دەبن بۆ فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەری خوا و لە ڕۆژی دواییش شایەنی تاجی وەقارو سەرفرازیو ئەمانەت پارێزی دەبێ.

پێغەمبەری خوا درودو سلاوی خوای گەورەی لێ بێ دەفەرموێ: {عَنْ أَبُو سَعِيدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ نَبِيُّ اللهِ ﷺ: «يُقَالُ: لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِذَا دَخَلَ الْجَنَّةَ، اقْرَأْ وَاصْعَدْ، فَيَقْرَأُ وَيَصْعَدُ، بِكُلِّ آيَةٍ دَرَجَةً، حَتَّى يَقْرَأَ آخِرَ شَيْءٍ مَعَهُ»}[7]

واتە: ئەبوو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: بە هاوەڵی قورئان دەگوترێ (واتە: ئەو کەسەی قورئانی خوێندوە، یان ئەو کەسەی قورئانی لەبەر کردوە) کە دەچێتە بەهەشت، بخوێنەو بەرز بەوەو سەرکەوە، جا هەر دەخوێنیو سەردەکەوێ بە هەموو ئایەتێك پلەیەك، هەتاکو کۆتا ئایەت کە پێیەتی (واتە: کە لەبەریەتیو تێگەیشتووەو کاری پێ کردوە).

---

٧) رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٧٨٠)، وَصَحَّحَهُ الألباني في "الصحيحة".

(إبن القيم) ڕەحمەتی خوای لی بێ، دەڵێ: پلەکانی بەهەشت بە ئەندازەی ژمارەی ئایەتەکانی قورئانن، مسوڵمان چەند ئایـەتی لەبـەربێ ئەوەنـدە پلە بەرز دەبێتەوە.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَجِيءُ الْقُرْآنُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ! حَلِّهِ فَيُلْبَسُ تَاجَ الْكَرَامَةِ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا رَبِّ! زِدْهُ فَيُلْبَسُ حُلَّةَ الْكَرَامَةِ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا رَبِّ! ارْضَ عَنْهُ، فَيَرْضَى عَنْهُ، فَيُقَالُ لَهُ: اقْرَأْ وَارْقَ وَتُزَادُ بِكُلِّ آيَةٍ حَسَنَةً» }(٨)

واتـە: ئـەبوو هـورەیرە خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتی: لـە ڕۆژی قیامـەت دا قورئـان دێ (لەگـەڵ ئـەو کەسـەی خوێندوویەتی لە دنیا) دەڵێ: ئـەی پـەروەردگارم! بیـڕازێنەوەو خشـڵی لەبەر بکەو ئیدی تاجی ڕێزی لەسەر دەنرێ، پاشان دەفـەرموێ: زیـاتری پێبدە، ئنجا جلو بەرگی ڕێـزی لەبـەر دەکـرێو دەڕازێنرێتـەوە، ئنجـا

---

٨) رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: ٢٩١٥، وَحَسَّنَهُ الألباني في "صحيح الجامع": ٨٠٣٠.

قورئان دەفەرموێ: ئەی پـەروەردگارم لێـی ڕازیبـە، خـواش لێـی ڕازی دەبێ، ئنجا بەو کەسە دەگوترێ: قورئان بخوێنەو سەرکەوە (بۆ پلـەکانی بەهەشت) وە هەموو ئایەتێك چاکەیەکی بۆ هەیە.

## ڕووداوی یەکەم

ئافرەتێکی مردوو شۆر کە بە دایکی ئەحمەد ناسراو بوو، خەڵکی شاری ڕیازی پایتەختی وڵاتی سعودیە بووە، ئەم ئافرەتە دەڵێ: من ساڵانێکی زۆر بوو خۆم تەرخان کردبوو بۆ شوشتنی ئەو ئافرەتانەی کە کۆچی دوایی دەکەن، ڕۆژێکیان چەند ئافرەتێك لەگەڵ شۆفێرێك لە دەرگای ماڵەکەمیانداو گوتیان: کچێکی گەنجمان کۆچی دوایی کردوەو هاتووین بۆ ئەوەی لەگەڵمان بێیتو بۆ شووشتنو کفن کردنی کچەکەمان، ئیتر منیش گوتم بەسەرچاوو خۆم ئامادە کردو لەگەڵیان کەوتمە ڕێ، کە گەیشتینە شوێنی مەبەست منیان برد بۆ گەرماوی ماڵەکەیان کە لاشەی کچە مردووەکەیانی لێبوو، ئیتر لە ناکاوێکا دەرگای ئەو گەرماوەیان لەسەر من داخست، منیان لەگەڵ کچە گەنجەکەیان بەند کرد و دەرگایان لەسەر داخستم ئیتر من زۆر ترسام و ڕا چڵەکام دەم و چاوی کچەکەم هەڵدایەوەو سەیرم کرد بینیم ڕوخساری ڕەش هەڵگەڕابوو سەیرێکی جەستەم کرد، بینیم جەستەشی بۆنێکی بۆگەنی لێدەهات، ئیتر زیاتر ترسامو بۆیە دەستم کرد بە هاوار و لێدانی دەرگا بەلاّم بێ ئەنجام بوو و هیچ کەسێك وەلاّمی نەدەدامەوە، ناچار بووم دەستم کرد بە

شۆردنی کچەکەو پاشان وشکم کردەوەو کفنیشی بۆ ئامـادەکرابوو ئـیتر کفنیشم کرد، جارێکیتر دەستم کردەوە بە هاوارکردن و لێـدانی دەرگـاو وتم ئەوە ئەو ئەرکەی بـە منتـان سـپاردبوو لـە شـۆردنو کفـن کردنـی کچەکەتان ئەنجامدا تکا دەکەم دەرگاکە بکەنەوە، ئیتر ئەم جارە کە ئـەو وتانەی منیان بیست بە دەنگ هاوار کردنەکەمەوە هاتن و دەرگاکـەیان کردەوە منیش ئەوەندە پەشۆکاو بووم خێرا ڕامکردو گەڕامەوە ماڵـەوەو زۆر بیرم دەکردەوە ئەرێ دەبێ ئەم کچە چ گوناهو تاوانێکی ئەنجامـدابێ تا حاڵی ئەوەندە خراپ بێت؟! بۆ دەستکەوتنی وەڵامی ئەم پرسیارە کـە هەموو هەستو ژیریو بیرکردنەوەی داگـیر کردبـووم دوای (٣) ڕۆژ بـۆ وەرگرتنی، وەڵامی ئەم پرسیارە سەردانی ماڵی ئەو کچە گەنجەم کردەوە، دوای گفتوگۆ گلەیی لە شێوازی مامەڵەکردنیان لەگەڵ منو بەند کردنم بە تەنیا لە گەرماوەکە لەگەڵ کچە مردوەکەیان لە وەڵامدا:

بە داوای لێبوردنەوە گوتیان: ناچاربووین، وا بکـەین، ڕێگـا چـارەیەکی دایکەمان نەبوو، چونکە پێش تـۆ (٧) ئـافرەتی ترمـان هێنـا بـوو بـۆ شووشـتنی کچـەکەمان، بـەڵام هـەر حـەوتیان بەرگـەیان نـەگرتو بـە پەشۆکاوی ڕایان دەکرد، بۆیە ناچار بووین دەرگا لەسەر تۆ دابخـەین بـۆ

ئەوەی تۆش وەك مردوو شۆڕەکانی تر بە ترس‌و پەشۆکاوی ڕا نەکەی، گوتم دەی دەکرێ بزانم کچەکەی ئێوە چ گوناه و تاوانێکی ئەنجامدابوو تا رووخساری ئاوا ڕەش هەڵگەڕێ‌و جەستەشی بۆگەنی کردبوو گوتیان: بە داخ و پەژارەیەکی زۆرەوە کچەکەمان لە نوێژ کردندا سستو کەم تەرخەم بوو، سەرەڕای ئەوەش حەزی لە خۆ جوانکردن‌و خۆدەرختسن بوو، ئامادە نەبوو ملکەچی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەری خوابێت صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وەك ئافرەتێکی بڕوادار بالاّپۆشی بکات.

## ڕووداوی دووەم

پیاوێکی بڕوادار دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: کچێکم هەبوو تەمـەنی (٢٠) ساڵان بوو ئەم کچەم زۆر دیندارو لە خـوا تـرس بـوو زۆربـەی کاتـەکان خەریکی خوێندنی قورئانو عیبادەت بوو پێـداگیر بـوو لـە ئەنجامـدانی شەونوێژەکانیو بالاَ پۆشێکی ڕێكو پێك بـوو، زۆر جـار مـنو دایکـی پێمان دەگوت: کچم پشوێك بدە تۆ زۆر هیلاکی بە خوێندنی قورئان خوا پەرستی بەڵام ئەو دەیگوت نا، خۆشی من لە خوا پەرستی و شەو نوێژ و قورئان خوێندنە، ئیتر ڕۆژێك گشتمان دەرچووین بـۆ سـەردانی هەنـدێك خزمو ناسیاومان هـەر لـە سـەرەتای دەرچـوونمان ئـەو کچـەم خـەریکی خوێندنی قورئان بوو، ئیتر لە نیوەی ڕێگادا تووشی ڕووداوی هـاتوو چـۆ بووین لـە ئەنجامـدا گشـتمان بـە سـەلامەتی دەرچـووین تـەنها کچـە دیندارەکـەم نـەبێ کـە زۆر بەسـەختی برینـدار بـوو، بـەڵام ئـەو هـەر قورئانەکەی تونـد بـە دەسـتەکانیەوە گرتبـوو، تـا دوا هەناسـەکانی و هەڵفڕینی گیانی پاکی، بەڵێ ئەمەیە سوننەت و بەڵێنی پەروەردگار لـە ژیاندا بەچی سەرقاڵ بی ژیانیشت هەر بەوە کۆتایی دێت.

## ڕووداوی سێیەم

شێخ خالد ڕاشد دەفەرموێت: پزیشکێکی ئافرەتی پسپۆڕی باڵاپۆش و لە خوا ترس‌و پاك گەشتێکی کرد بۆ ئەورووپا بە ئامانجی بەشداری کردن لە کۆنفرانسێکی زانستی پزیشکی لە کاتێکدا ئەو نیقابی دەپۆشی کۆمەڵێك ئافرەتی سفوری مەسیحی ڕوویان لەم ئافرەتە پاکە کردو تانەو تەشەرەیان لێدەداو پێیان دەگوت داخوا خاوەن چ ڕووخسارو قێزێکی ناشرینە بۆیە ئەم نیقابەی پۆشیوە؟! ئیتر ئەم ئافرەتە لە خوا ترسە زۆر بە ئارام بوو چاوەڕوانی دەرفەتێکی دەکرد بۆ وەڵامدانەوەی جوان و پڕ لە حیکمەت ئیتر لە کاتی پشووداندا بە دەرفەتی زانی‌و بانگی ئەم ئافرەتانەی کرد لە ژوورێکی تایبەت بە ئافرەتان نیقابەکەی داناو ئافرەتە مەسیحیەکان بینیان ئافرەتێکی زۆر جوان‌و شۆخ‌و شەنگە سەریان سوڕما ئەم جارە گوتیان: تۆ ئازاد نیت، ئەم نیقابەت هاوسەرەکەت بە سەرتی سەپاندوە و فەرمانی ئەو جێبەجێ دەکەی، ئەویش گوتی: سوێند بە خوا پۆشینی ئەم نیقابە تەنها ملکەچی منە بۆ فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەری خوا، وە ئەگەر لەبەر خاتری ڕەزامەندی پەروەردگار نەبووایە هەرگیز ئامادە نەبووم فەرمانی هیچ کەسێکی ترم جێبەجی بکردایە،

ئیتر بە شێوازێکی ئەوەندە جوان و پڕ لە حیکمەت گفتوگۆی لەگەڵ کردن

هەر لەم کۆڕبەندە حەوت ئافرەتی کرد بە مسوڵمان.

## ڕووداوی چوارەم

پیاوێك دەگێڕێتەوەو دەڵێ: کچێکم هەبوو زۆرم خۆشدەویست بەڵام قەدەری خوا وابوو نەخۆشی تاعون لە شارەکەمان بڵاو بوویەوە ئیتر کچەکەی منیش یەکێك بوو لە توشبووانی ئەم ڤایرۆسە، وە دواجار بووە هۆی گیان لە دەستدانی، ئیتر بە مردنی ئەو زۆر غەمبارو بێ تاقەت بووم، هیوا خوازبووم شەوێك لە خەو بیبینم خوای گەورە ئاواتەکەمی هێنا دی‌و لە خەوا بینیم‌و لێم پرسی کچە جوانەکەم گیان کێشان و مردن چۆنە؟ بۆم باسبکە، گوتی باوکە گیان! گیان کێشان و مردن زۆر سەختە خۆ ئامادەکردنی دەوێ، ئنجا ڕستەیەکی زۆر بەهێزی پێ وتم کە هەرگیز لە یادی ناکەم، گوتی: (کنا نعلم ولا نعمل)، واتە: ئێمە دەمانزانی، بەڵام کارمان پێی نەدەکرد.

## ڕووداوی پێنجەم

ئافرەتێکی سعودی دڵێ: سەردانی کۆمەڵێك خزمو کەسمان کرد، کە لە شارێکی دیکە بوون، چەند ڕۆژێك لە لایان ماینەوە، زۆر دڵخۆش بووین لەگەڵیان، ئەو ڕۆژەی کە بڕیار بوو بگەڕێینەوە بۆ شارەکەی خۆمان پورم نیوەڕۆ خوانێکی ڕێکخست بۆمان، منیش پێش دەرچوون ویستم لە تەواوی پۆشینی بالاّپۆشیی و لەچەکەکەم دڵنیاببمەوە، سەیری ئاوێنەم کرد، هەستم کرد کە دوو پشکێکی ناسروشتی بەسەر سەرمەوەیە، بە پەلە گرتمو دام بە زەویداو هاوارم لێ بەرز بوویەوە، گوتم: ئەمە چی بوو؟ لە کوێ هات؟ شتی وام نەبینی بوو، دوای کوشتنی دوو پشکەکە تۆزێك ئارام بوومەوە، زۆر سوپاسی خوای گەورەم کرد، زانیم ئەو منی پاراستوە، بە هۆی ئەو لەچەکەی کە بە فەرمانی ئەو لەسەرم کرد بوو.

## گرنگی دانی پێغەمبەر ﷺ بە ئافرەتان و کچان

تاریکترین و ناخۆشترین ڕۆژەکانی مرۆڤ پێش هاتنی ئیسلام بریتی بوو لە هاتنە دنیاو لە دایك بوونی کچۆڵەیەکی بەخشراوی خوا، لەم ڕۆژگاردا هەر کەسێك موژدەو هەواڵی ئەوەی پێدرا بووایە کچێکی بووە، زۆر هەستی بە شەرمەزاری دەکردو زۆر بێهێز دەبوو، وە هەروەها دەم و چاویشی تاڵ و ڕەش هەڵدەگەڕا، لە بەرانبەر ئەم هەواڵە، بۆیە ڕاستەوخۆ بیری لەوە دەکردەوە چۆن بە زووترین کات هەوڵی لە ناوبردنی ئەو منداڵە بچووکی بدات کە تازە چاوی بە دنیا هەڵێناوە، ئەمەش نەریتێك بوو زۆربەیان لەسەری پەروەردە بوو بوون، وەك خوای پەنهانزان بۆمان باس دەکاو دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلۡأُنثَىٰ ظَلَّ وَجۡهُهُۥ مُسۡوَدّٗا وَهُوَ كَظِيمٞ ﴿٥٨﴾ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓۚ أَيُمۡسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمۡ يَدُسُّهُۥ فِي ٱلتُّرَابِۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾النحل.

واتە: (بێبڕوایان) کاتێك یەکێکیان موژدەی کچێکی پێ بدرێ دەم و چاوی ڕەش هەڵدەگەرێ و پیش دەخواتەوە، وە خۆی دەشارێتەوە لە خەڵکی لەبەر ئەو موژدە خراپەی کە پێی دراوە، ئایا بیهێڵێتەوە بە شەرمەزاری و سەرشۆڕی (و بە خێوی بکات) یان زیندە بە چاڵی بکات؟! ئاگاداربن و بزانن ئای چەندە ئەوە چەندە بڕیارێکی خراپە دەیدەن.

وە هەر دەربارەی زیندە بە چاڵ کردنی کچۆڵانو پرسیار لێکرانیان لە ڕۆژی دوایی خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ ﴿٨﴾ بِأَىِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ ﴿٩﴾﴾التكوير، واتە: وە کاتێك پرسیار کرا لە کچانی زیندە بە چاڵ . کە بە هۆی چ گوناهێکەوە کوژران؟! دیارە منداڵێك کە تازە بووە هیچ گوناهی نەبووە!

بەڵام دوای هاتنی شەریعەتی پڕ حیکمەتی خوای پەروەردگار بۆ دەرباز کردنی هەموو بەندەکان، ئافرەتان بە گشتیو کچان بە تایبەتی ڕێزو پلەو پایەی خۆیان بۆ گێڕدرایەوە، بۆ ئەوەی ئەم قسەمان بسەلمێنین، با گوێ لەم دەقانەی خوارەوە بگرین:

١/ {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ ﷺ: «مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ حَتَّى تَبْلُغَا، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنَا وَهُوَ»، وَضَمَّ أَصَابِعَهُ}[٩].

---

٩) رَوَاهُ مَسْلِمٌ: ٦٨٦٤.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دوو کچۆڵە بە خێو بکات هەتا بالغ دەبن، لە ڕۆژی قیامەت کە دێت من ئەو ئاواین، پەنجاکانی هێنا تەنیشت یەك!

٢/ {أَنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا زَوْجَ النَّبِيِّ "ﷺ قَالَتْ: جَاءَتْنِي امْرَأَةٌ وَمَعَهَا ابْنَتَانِ لَهَا فَسَأَلَتْنِي فَلَمْ تَجِدْ عِنْدِي شَيْئًا غَيْرَ تَمْرَةٍ وَاحِدَةٍ، فَأَعْطَيْتُهَا إِيَّاهَا، فَأَخَذَتْهَا فَقَسَمَتْهَا بَيْنَ ابْنَتَيْهَا وَلَمْ تَأْكُلْ مِنْهَا شَيْئًا، ثُمَّ قَامَتْ فَخَرَجَتْ وَابْنَتَاهَا، فَدَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ: فَحَدَّثْتُهُ حَدِيثَهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنِ ابْتُلِيَ مِنَ الْبَنَاتِ بِشَيْءٍ فَأَحْسَنَ إِلَيْهِنَّ كُنَّ لَهُ سِتْرًا مِنَ النَّارِ»}(١٠)

واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، خێزانی پێغەمبەر ﷺ گوتوویەتی: ئافرەتێك هات بۆ لام دوو کچی خۆی لەگەڵ بوون، داوای (خواردنی) لێکردم منیش هیچ شتێکم لەلا دەست نەکەوت جگە لە یەك دەنکە

١٠) أَخْرَجَهُ مَسْلِمٌ برقم: ٦٨٦٢.

خورما، وە ئەو دەنکە خومایەم پێدا، ئەویش لێی وەرگرتم‌و دابەشی کرد لە نێوان دوو کچەکەو خۆی هیچ شتێکی لیّ نەخوارد، دوایــی هەنــدێك وەستاو لەگەڵ دوو کچەکەی ڕۆیشتن، پاشان پێغەمبەر ﷺ هاتەوە لام، منیش ڕووداوەکەم بۆ باسکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسـێك تاقیی بکرێتەوە بە دوو کچان، ئەویش لەگەڵیان چاکەکار بوو ئەوە بـۆی دەبنە بەربەست لە ئاگرو دەیپارێزن.

٣/ {عَـنْ عَائِشَــةَ رَضِـيَ اللهُ عَنْهَـا قَالَـتْ: قَـالَ رَسُـوْلُ اللهِ ﷺ: «لَـيْسَ أَحَـدٌ مِـنْ أُمَّتِـي يَعُـولُ ثَـلاَثَ بَنَـاتٍ، أَوْ ثَـلاَثَ أَخَـوَاتٍ، فَيُحْسِنُ إِلَيْهِنَّ، إِلاَّ كُنَّ لَهُ سِتْراً مِنَ النَّارِ»}[11].

واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، پێغەمبەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: هیچ یەکێك نیە لە ئۆممەتی من سێ، کچ یان سێ خوشك بە خێوبکات، وە چاکەکاربێ لەگەڵیان، ئـەوە بـە دڵنیـایی بـۆی دەبنـە بەربەسـتێك‌و دەیپارێزن لە ئاگری دۆزەخ.

---

١١) رَوَاهُ البَيْهَقيُّ ١١٠٢٣، وَصَحَّحَهُ الألباني في "صحيح الجامع": ٥٣٧٢.

٤/ {عَنْ أَبي هُرَيْرَة رَضِيَ اللّه عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ ﷺ: إِذَا صَلَّتْ الْمَرْأَةُ خَمْسَهَا، وَصَامَتْ شَهْرَهَا، وَحَفِظَتْ فَرْجَهَا، وَأَطَاعَتْ زَوْجَهَا، قِيلَ لَهَا ادْخُلِي الْجَنَّةَ مِنْ أَيِّ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ شِئْتَ} [١٢].

واته: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئافرەت: پێنج نوێژە فەرزەکانی کردو، ڕۆژووەکانی مانگی ڕەمەزانی گرتو، داوێنی خۆی لە (خراپە کردن) پاراستو، گوێڕایەڵی پیاوەکەی کرد لە (کاری باش)، پێی دەگوترێ: بڕۆ بەهەشتەوە لە کام دەرگای بەهەشتەوە حەز دەکەی.

الْحَمْدُ للهِ الَّذِي بِعِزَّتِهِ وَجَلالِهِ تَتِمُّ الصَّالِحَات.

---

١٢) أخرجه ابن حبان برقم: (٤١٦٣)، قال شعيب الأرنؤوط: صحيح.

| ناونیشان | لاپەڕە |
|---|---|